# " لە پێناو چـــــاو چـــــی دا "

ئەو کوان و دەمەڵە پیسە پڕ لە کێم و چڵك و زوخاوەی کە لـــــە کونگرەی چوارەوە ، وەك شیر پەنجە گشت رەك و پۆی لەش و گیانـــــی ڕێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی داگرتبوو ، دایدا بوە نێو بەدەنەی حیزب و رۆژ بەرۆژ کرمژنی دەکرد و بەرەو لــــەر و لاوازی دەبرد ، ئاخرەکەی لە کونگرەی هەشت دڕا و کێم و چلك و پیسایی‌یەکــەی هاتە دەر و بە نێو لەش و گیانی حیزب دا بڵاو بۆوە و بێگومان بـــــۆ جولانەوەی رزگاریخوازی گەلەکەمان لە کوردستانی ئێران زیانیکی زۆری هەیە و بەرەو لاوازی دەبات ٠

فەرق و جیاوازی ئەو کوانە پیسەی لەشی ڕێبەرایەتی ح٠ د٠ ك ٠ ا ــ لەگەڵ کوان و دۆمەڵی لەشی زەلامیك لەوە دایە کە لە کاتیك کوانـــــی لەشی مرۆڤ دەربوو ، چلك و کێمەکەی دێتە دەر و برینەکەی بەیەك دۆو دەست مەڵحەم و هەتوان و بە لەسەر دانانی گەلا " رەکێشە " برینەکــەی ساریژ دەبێ و قرتماغە دەبەستێ و حەلەمی لێ دەبرێ ٠

بەلام دەر بوونی کوان پیسەی لەشی ڕێبەرایەتی ح٠د٠ ك ٠ا نەك هەر ژان و دەرد و ئوفی بەدەنەی حیزبی لەبەین نەبرد و نایبات و برینـــــی ساریژ نەکرد و نایکات ، بەلکوو وەك خۆرە هەموو بەدەنەی حیـــــزب دەتەنێتەوە و ژان و دەردەکەشی زیاتر دەکات ٠

ئاخافتن و نووسین و شەرە دندووکەی هیچ یەك لەو دوو بەشەی کـــــە هۆی بنەمای ئەو کوانەو دۆمەڵە بوون ، ناتوانن چاری ئەم ژان و دەردە بکەن٠ چونکە هیچ کامیان مەبەستیان چارە سەرکردنی گیرو گرفتـــــی کۆمەلی کوردەواری و بردنە پێشی خەباتی حیزبی نیە ٠

## باسەکەمان لەسەر چی یە ؟

ڕۆژی هەوەڵی مانگی خاکەلێوەی ١٣٦٧ - ٢١ ی مارسی ١٩٨٨ ڕۆژی نەورۆزی کوردی ، واتە چەند ڕۆژ پاش داگیر کردنی شاری هەڵەبجە و خورماڵ و سیروان و ناوچەی شارەزوور لە لایەن هێزی داگیرکەری ڕیژێمی کۆنەپەرستی ئاخوندی ئیران و چوار ڕۆژ دوای بۆمبارانی ئەو شارانە لە لایەن فروکەکانی حکومەتی فاشیستی بەغداوە ؛ بە بۆمبای کیمیاوی و گازی ژاراوی کە بوو بە هۆی قڕ کردنی بە کۆمەڵی پتر لە ٥ هەزار کوردی بێ تاوان و برینداربوون و ئاوارە کردنی دەیان هەزار کەسی تر ، ڕاست لەو کاتە دا کە جەژنی نەورۆز لەگەڵی کورد ببوە شین و تازیە و بیزاری و توورەیی گەلی کورد لە داگیرکەر و جنایەتکاران بەرز ببۆوە و سەبەبکارانی ئەو جنایەتە تف و لەعنەت دەکران ٠

ڕاست لەو کاتە دا کە خۆپێشاندانی ڕەخنەو بێزاری و نارەزایی کوردەکانی دوورە وڵات ، لە شارەکانی ئوروپا و ئەمریکا دژی ئەو جنایەت و کارە ساتە داخدارە ، شارەکانی تە نیبووەوە ، لە لایەن دەستەیەکی ١٥ کەسی لە ڕێبەرایی ح ٠ د ك ٠ ا ، لە ناوچەی ژێر ڕەحمەتی بەعسی جنایەتکار دا ، بەیاننامەیەك بڵاو کرایەوەو لەت بوونی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئیرانی وەك " مژدە " یەك بە خەڵك ڕاگەیاند ٠

بە واتەیەکی تر ، لەو کاتە دا کە جنایەتی داگیرکەرانی کوردستان و قەلاچۆ کردنی ژن و منداڵی کورد پرسە و پەژارەی لە خوێن گەوزاوەکانی خەڵکی بێ تاوان ، وای لە خەڵك کردبوو کە لە گشت قسەو باس و ئاخافتن و نووسین و کۆبوونەوەیەکدا ، تاقە ڕێگای ڕزگاری لە بن دەستی و نەجات بوون لە توانەوەو فەوتانیان لە یەکێتی و یەك گرتنی هێزە

ئازادیخوازەکانی کورد دەزانی ، دەستەیەك لە ڕێبەرایی حیزبی دیموکرات ناوی " ڕێبەرایەتی شورشگێر " یان لە سەرخۆدانا و جیا بوونەوە لە حیزبی دیموکرات یا " وەدەرنانی فراکسیون "ی بە گەلی کورد ڕاگەیاند ·

بە قەولی شاعیر :

" ئەلحەق هونەری کورد ، سولەیمان بەگی یاوەر "

دوا بەدوای بلاو بوونەوەی بەیاننامەی نابراو ، لە لا یەك ڕاگەیاندنی پشتیوانی ( نیوەو چواریەك و بەشی زۆری ) کادرو پیشمەرگە و ڕێکخراوەکانی حیزب لە " ڕێبەرایەتی شورشگێر " وەك لافاوی بەهار هێنابنی ! بە هۆی پەیك و پۆستەی " ڕێکخراوی موجاهیدینی خەلکی ئیران ، ئەو دۆستە دلسۆزەی گەلی کورد " ! دەگەیشتنە ئوروپاو لە لایەن ئەندامانی " ژیر و دنسوزی " حیزبی دیموکراتەوە بلاو دەکرانەوە ·

لە لایەکی دیکەش نووسراوەی پر لە هەرەشەو گورەشە و وشەو زاراوی بێ تامی کونی لە باو کەوتووی کومیسیونی سیاسی - نیزامی حیزب و دەفتەری سیاسی بە خەلك دا دەگەران و لە ستکهلم لە " میزی کتاب " شوێنی چەقە و دم بە دمەی " شورشگیرانی ئیرانی " دادەنران و هەر تك لا بێ ئەوەی کە بیر لە چارە نووسی داخداری ئەوڕۆی جولانەوەی کورد بکەنەوە ، دەتگوت مزگێنی ئەستاندنی " خودموختاری" یان بۆ گەلی کورد هێناوە ·

لەوە سەیرتر : ئەوانەی تا دوو ڕۆژ بەر لە بەیاننامەی یەکی خاکەلێوە ، دەروێش و گوێ لە مستی کوێرانەی ڕێبەراتی حیزبی دیموکرات بوون و بێ ئەوەی تێ گەیشتبن بۆ چی خەباتیان کردووە و لە سەر چی دەربەدەر بوون و ئەو ڕێبەرایەتی‌یە چی بەسەر بزووتنەوەو بە سەر ح · د · ك · ا · هێناوە ، بۆیان لە ملی حەدا و بە سازو هەوای ڕێبەرایەتی سەمایان دەکرد و فەرمایشی سکرتیرو " فەرماندەی گشتی "

ـ ر ند ئايمى فورعان دەزانی له پر کەوتنه جم و جوڵ و هەڵسوران و چالاکی و ١٨٠ دەرەجە وەرسووران و بایانداوه ٠

ـەلام نەك بۆ خزمەت بە بزووتنەوەی کورد . نەك بۆ ناساندنی حصابی رەوای میللەتەکەیان . نەك بۆ فێر بوون و ئەزموون وەرگرتن لە بروننەوەی گەلانی خەباتگێر . نا ٠٠٠ نەك بۆ ئەوانە ٠٠٠ بەلکوو بۆ فراوانر کردنی کەلێنی پەیدا بووی نێو حیزب . بۆ قووڵتر کردنی پاکۆکی و سار کردنی دووبەرەکی و دۆزینەوەی ناو و نرتکەی بێ ماناو غەیره سیاسی کە ئەوەش خۆی بەرهەمی پەروەردە کردنی چەند ساڵەی ریبەرایەتی ح ٠ د٠ ك ٠ ا ٠ بوو ٠ لە جیاتی تئوری شورشگیری فێری بوون ٠

هەندی دەسته و تاقمی زۆر کەسی و چەند کەسیش کە خۆشیان لە بەر پاکۆکی نێو خۆیی هەموو لەشیان دافەتاوه و لە کوردستان و لە ئوروپا خۆیان گرتوتەوه و خەریکن لە ئورپاوه ولات رزگار کەن و بە هێزی پرولتاریای کورد سیستمی سەرمایەداری لە ئیران دا لە بەین بەرن و ریژیمی خومەینی دارمێنن ، کەوتنه دەرکردنی بەیانتامەو هەڵوێست دەربرین و سەبارەت بە " پەرەگرتنی دیموکراسی و پلورئالیزم و ئازادی نیکوشان و نەهێشتنی پاوانخوازی و بە هێز بوونی بزووتنەوەی " میللی، کورد " پیشنیازیان لە لەت بوونی حیزبی دیموکرات کرد و ئەم جیاوزنەوەیان بە چوونه پێشی خەباتی گەلی کورد داناو دڵسۆزی خۆیان ـر ئەم میللەتەی کە ئێستا کەوتوته بەر شالاو و نەمان هەرەشەی ی .ەکا دەربری ٠ بەلام هەر لەو کاتەش دا لە ئاست جنایەتی حکومەتی بەغداو قر کردنی ٥ هەزار کورد لە هەلەبجە دمیان هەڵنەپچراو هەلەمیان بە سەر کاغەز دا نەهێنا !!

ـەم نیوه دا ئەرکی خەباتگیرانی راستەقینەی جولانەوەی رزگاریخوا ـ ی کورد نیکوشەرانی ریگای بەختەوەری رەحمەتکیشان و دوژمنانی

چەوسینەر و داگیرکەران و لایەنگرانی ڕێبازی ئازادی و دیموکراسی و سوسیالیزم لە کوردستانی ئیران ، چی یە ؟
هەڵوێست و کردەوەو تێکوشانیان ئەشێ چۆن بێ ؟
وەلامی ئەو پرسیارانە هەر وا هاسان نیە ٠ ئەوبارو دۆخە ناهەموارەی کە ماوەی ٩ سالی رابردوو کوردستانی ئیرانی گرتۆتەوەو ڕێبەرایەتی ح ٠ د ك ٠ یش بۆ سەپاندنی دیکتاتوری و سیاسەتی چەوت کەلکی خەراپی لێ وەرگرتوە و ئەم وەزعە بزووتنەوەی کورد تووشی هاتووە وەلامی ئەو پرسیارانە وە زەحمەت دەخات ٠ بە تایبەت کە زنجیری بەرو بووی ئەم بارو دۆخەو ئەم سیاسەتە لە دەست و پێی تیکوشەرانی راستەقینە ها لاوە ٠ لە نیشتمان و لە خەلك دوور کەوتوونەوە ، ژیانی ئوروپا و دەربەدەری هەزاران تەنگ و چەڵەمەی هێناونەتە سەر رێگا ، بەشی زۆری ئەو رۆڵە فیداکارانەی کە لە خەبات دا پێشوازیان لە مەرگیش دەکرد ، لە ئوروپا پاسیف و وەڕەزو بێزار بوون ٠
هەر ئەو هەول و مەرجەنالمبارەش بۆتە هۆی ئەوە کە هەندێ کەس زیرەکی سیاسی و ماستاوکەر لە مەیدانی چۆلدا شەرناخێویی بکەن و " کەڵە شیر ببێتە بولقاسم " ٠ هەر بۆیەش نە وەلامی پرسیارەکان دەدرێتەوە و نە دەکرێ ئەرك و رێباز بۆ تیکوشەران دیاری بکەی ٠
بەلام بۆ کەسیکی پتر لە ٤٠ سال ژیانی پر لە کوێرەوەری خۆی لە پێناو ئازادی و بەختەوەری گەل و نەهێشتنی چەوسانەوەی زەحمەتکیشان تەرخان کردبێ ٠ بە تاوانی بیروباوەری مارکسیستی و لایەنگری لە سوسیالیزم و دیفاع لە زەحمەتکیشانی کورد بە دەیان جار کەوتبێتە بەر پەلاماری دوژمن و حەپس و دەربەدەری و بەر شالاوی کۆنەپەرستی بەرەلا و سەرسەری و نوکەرانی بیگانە ، بێدەنگی و بێ لایەنی قەباحەتە و چاوپووشین و بیروڕا دەرنەبرین بۆ لێ بووردن نابێ ٠
لە سەر ئەو بنەمایە و بە گوێرەی هەست کردن بە بەرپرسی وەك

ئەندامێکی پچووکی کۆمەڵی مەزنی نەتەوە بەشخوراوەکەم لە ئاست چارەنووسی گەل و خەباتی رزگاریخوازی دا . ناتوانم بێدەنگ بمو هەروا سەیری رووداوەکان بکەم •

بێجگە لەوە ، سەبارەت بە رێز گرتن لە نامەو تەلەفون و داوا کاری بەرەو رووی هاورێ و دۆست و برادەران کە داوایان لێ کردووم وەك کەسێکی کە سالەها لە حیزبی دیموکرات دا تێکوشاوم و بەرپرس بووم و لە هەموو کەین و بەین و سیاسەت و خەسڵەتی رێبەرانی حیزبی دیموکرات شارەزام ، لە سەر پێکهاتنی ئەم وەزعە بنووسم و هۆی ئەم لەت بوون و شەرە دندووکە روون بکەمەوە • بەو بۆنەوە هاتمە سەر ئەو باوەرە، با بە کورتیش بێ بیروڕای خۆم لە سەر ئەو بەزم و هەرایەی کە هیچ دیاردەیەکی ناکۆکی بیروباوەرو ئیدئولۆژی و سیاسی تێدا نابینم ، دەربیرم •

بەو هیوایە ئەم کورتە نووسینەی من بتوانێ تا رادەیەك ئەندامانی سادە و دڵپاك و فیداکاری حیزبی دیموکرات روون بکاتەوە و بە سوودی بردنە پێشی خەبات و بە هیز بوونی جولانەوەی رزگاریخوازی کوردستانی ئیران کەلکی لێ وەربگرن •

بۆ ئەو مەبەستە نووسینەکەی خۆمان لە چەند خاڵ دا کورت دەکەینەوە

**١ـ رێبەرایەتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئیران**

**٢ـ هۆی جیا بوونەوەی بەشێك لە رێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و بە یاننامەی ١٠ مادەیی**

## ١ـ رێبەرایەتی ح • د • ك • ا

لەبەر ئەوە لە بەرگی چوارەمی بیرەوەریەکانم دا بە وردی چۆنیەتی رێبەرایەتی و سیاسەت و تێکوشان و کونفرانس و کونگرە و کۆبوونەوەکانی ح • د • ك باسی دەکەم ، ئیتر لێرەدا بە پێویستی نازانم بچمە

نێو قوولایی ئەو باسەو تەنیا سەر پێی بە سەری دا دەرۆم ۰

دەتوانین لە کونفرانسی سێیەمەوە ( جوزەردانی ١٩٧١ ) بە شکلی حیزبایەتی باسی شێوەیەکی رەسمی رێبەرایەتی هەڵبژێردراو و کومیتەی ناوەندی بکەین ۰ بەرنامەو پرۆگرامی شکل گرتووی حیزبیش دوای کۆماری دیموکراتی کوردستان هەر لەو دەمەوە هاتۆتە کایەوە ۰

پاش رزوخانی کوماری کوردستان ئەندامانی حیزب بە شێوەی جۆر بە جۆر بۆ زیندوو کردنەوەی حیزب تێکوشاون و رێبەرایەتی چەند کەسە و تەقە کەسەی بێ هەڵبژاردن کەم یا زۆر خەباتی بەرێوە بردوە ۰

پاش کونفرانس سێیەمیش رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات قەت یەك دەست و یەك بیرو باوەر تەبا نەبوە ۰ لە نەخوێندەوارەوە بگرە تا دوکتوری ئیقتساد و لە سەودا گەرەوە بگرە تا هەژارو برسی ، لە مارکسیەوە بگرە تا مائویست و ئاژاوە چی ، لە پێشکەوتووخوازەوە بگرە تا کۆنەپەرست و بێ بیروباوەر ، بەلام لەسە بەرنامەی حیزب کە ئەو دەم پێشکەوتووخوازو وەلام دەری ئەو قوناخەی خەبات بوو ، کۆ ببوونەوە ۰

لەو ماوەیەش دا ، تاگەرانەوە بۆ ئیران و بەستنی کونگرەی چوار ، سەرەرای ئەوە کە دوکتور قاسملو وەك سکرتیری حیزب هەوڵی داوە کە بیروڕای خۆی بە سەر کومیتەی ناوەندی دا بسەپێنێ ، بەلام تەواوی بریارەکان بە تیکرایی و یا بە زۆربەی دەنگ دراون ۰ دوکتور قاسملو بۆ سەپاندنی بیروڕای خۆی شێوەی جۆر بەجۆری بە کار هێناوە ۰ لە هەموو کەس پتر باسی دیموکراسی کردوە و لە هەموو کەسیش پتر دیموکراسی پێ شێل کردوە ۰ لەبەر ئەوەی ئەو دەم کەسانی ئەوتۆ لە رێبەرایەتی دا هەبوون کە رێگا نەدەن تاقە کەسێك بۆ چوونی خۆی بەسەر حیزب دا بسەپێنێ ، زۆر جار پاشەکشەی کردوە ۰ جاری واش هەبوە شەوی پێشتر دەنگ وەرگرتن یەك دوو کەسی هەلپەرست و بوودەلەی لە ئەندامانی

کومیتەی ناوەندی بانگێشتن کردوه و سۆزی زۆربەی دەنگەکانی بۆ لای خۆی راکێشاوە. هەر کاتیکێش هەستی بە مەترسی و باو بۆرانی هەوا کردبێ ، بیانویەکی دۆزیوەتەوە و بۆی دەرچوە.

پاش گەرانەوە بۆ ئیران ١٩٧٩ هەل و مەرجیکی تازە و تایبەت و بائاسایی لە ولات دا هاتبوە پێش . نە شارەزایی خەلك هەلچوونی کف و کولی خەبات و ماستاو کردنی هەندێ وردە بورژوازی بێ بیروباوەر و خۆ وەپێش دانی هەندێ کەسی بە نماو کادر و ئەندامی حیزبی و بە کردەوە خزمەتکار و نۆکەرسیفەت، لەگەل بارو دۆخی شەرو کێشە لە ولات ، پتر مەیدانی بۆ دوکتور قاسملو چول کرد کە دیکتاتوری خۆی بسەپێنێ. هەر چەندە ئەو دەمیش ئەندامانی کومیتەی ناوەندی کە شارەزای بوون ، زۆریان بە دەمەوە نەدەدا و قافیەی لێ وەتەنگ دەگەرا.

دەبوایە بە جۆرێك یەخەی خۆی لە چنگ ئەو شارەزایانەی فروفیلی ئەو رزگار بکا . بۆ ئەو مەبەستە بەزمی کونگرەی چواری ساز کرد . لە راستی دا کونگرەی چوار سەرەتای سەپاندنی دیکتاتوری تاقە کەسە بوو بە سەر حیزب دا . کونگرەی چوار سەرەتای ئاشکرا بوونی دوو بیروباوەری جیاواز بوو ، بیروباوەری پێشکەوتنخوازانە و بیروباوەری کۆنەپەرستی و لیبرالانە . کونگرەی چوار بۆ ئەوە ساز کرا کە چەند کەسی سادە و ساکاری مەیدانی سیاسەت و ریاکارو نوکەرسیفەت بە ناوی کومیتەی ناوەندی لە دەوری سکرتێر کۆ ببنەوە.

دوکتور قاسملو باش لەو پەندەی ماکیاویل شارەزا بوو، کە بە شازادەی دەگوت : " ئەی شازادە ، ئەگەر دەتەوێ لەسەر تەختی پاشایەتی بمێنی ، جارو بار وەزیرەکانت بگۆرە ، تا دەتوانی وادە و بەلێنی بە خەلك بدە و خەلك هیوادار رابگرە ...." .

تا بارو دۆخی ولات شپرزەتر دەبوو ، دیکتاتوری دوکتور قاسملو پتر دەچەسپا . ئەوانەی لە دەوروبەری کۆ ببوونەوە پتر بە شان و بالیان

هه‌لا ده‌گوت . ئه‌ویش که‌سانی مه‌رایی که‌رو دوو رووی له ده‌وری خـــۆی کۆ ده‌کردنه‌وه .

دوکتور قاسملو بۆ سه‌پاندنی ڕێبازی سوسیال دیموکراسی و ئانتـــی کومونیستی خۆی به سه‌ر حیزب دا که له کونفرانسی سێیه‌مه‌وه هه‌ولـــی بۆ دەدا ، پاش گه‌رانه‌وه بۆ ئیران له دوو هۆکارکه‌لکی وه‌ر ده‌گرت .

یه‌که‌م شپرزه‌یی بارو دۆخی کوردستان ، سه‌پاندنی شه‌ر له لایـــه‌ن کوماری نا ئیسلامی‌یه‌وه ، به تایبه‌ت پاش هه‌ڵه‌ی مێژوویی تاقمـــــی حه‌وت که‌سه و مه‌یدان چول کردنی ئه‌وان ئیتر هه‌رکه‌س له حیـــزب دا ره‌خنه‌ی گرتبایه و یان بیروراییه‌کی به پێچه‌وانه‌ی بۆ چوونی ڕێبه‌رایه‌تـــی هه‌بایه ، به توده‌یی و به لایه‌نگری حه‌وت که‌سه تاوانبار ده‌کرا .

کومیسیونی بازره‌سی به شێوه‌ی ژاندارمه‌ی حکومه‌تی په‌هله‌وی به گـــزی داده‌چوو ده‌یخسته ژێر پرسیاره‌وه . به پیره‌وی له سیاسه‌تی خومه‌ینـــی و هه‌موو دیکتاتوریکی ترسه‌نووک ، به‌و بیانوه که " له شه‌ر دایـــــن و ره‌خنه گرتن وره‌ی خه‌لك كز ده‌کا " ، ره‌خنه گر سه‌رکوت ده‌کرا .

دووه‌م فه‌رد په‌رستی که‌سانی بووده‌ڵه‌و بێ پرنسیب و بێ شه‌خسیه‌ت که به ناوی کومیته‌ی ناوه‌ندی و مشاویرو جێگرو کومیسیونی بازره‌ســـی له ده‌وری سکرتیر کۆ ببوونه‌وه . ئه‌وانه بێ ئه‌ولاو لا بۆیان له ملـــــی ده‌داو فه‌رمایشتی ئه‌ویان پێ ئایه‌تی عاسمان بوو .

ته‌ماشای بریاری کۆبوونه‌وه‌کانی ده‌فته‌ری سیاسی و پلینومه‌کانـــی ئه‌و سه‌رده‌مه ( له کونگره‌ی چواره‌وه تا کونگره‌ی ٨ ) بکه‌ن ، هه‌موویـــان به تێکرایی ده‌نگ په‌سند کراون و که‌سێ نه‌بوه بیرورایه‌کی دژی هه‌بێ .

به‌لام له‌سه‌ر ئه‌وه شه‌وه ، تا ئه‌و ده‌مه‌ی که کادرو ئه‌ندامانی حیزب لـــه ولات و له نێو خه‌ڵك دا مابوون و نیشتمانیان به جێ نه‌هێشتبوو . لـــه خاکی کوردستانی عێراق نه‌که‌وتبوونه به‌ر سێبه‌ری ره‌شی حکوومه‌تـــی به‌عسی بۆی نه‌ده‌لوا و پرکێشی نه‌ده‌کرد که به ره‌سمی ڕێباز و پروگرامی

حیزب بگۆرێ ، هەرچەندە لە بواری سیاسی دا بە گوێرەی ویست و بـــۆ چوونی خۆی رایدە دا ٠

کونگرەی ٥ نمونە بوو٠ لەویدا ویستی رێبازی " سوسیالیزمـــــی- دیموکراتیك " واتە سوسیال دیموکراسی بە سەر حیزب دا بسەپێنـــێ، بەلام لەگەڵ بەرهەڵستی بەشی زۆری نوێنەرانی کۆنگرە بەرەو روو بـوو٠ بە گوێرەی دابی خۆی پاشەکشەی کرد٠

چوونە نێو شورای بەرگری میللی سەپاند کە تەنانەت ئەوانـــــەی ببوون بە ئەندامی کومیتەی ناوەندیش بەرنامەکەیان نەخوێندبـــوّوە و نەیانزانی بوو ، دەنگیان بۆ چی داوە ٠

تەنیا ئەوە بوو ئاغای مەسعودی رەجەوی " مەئموریەتی " دابوو بـە دوکتور قاسملو کە بەرنامە بە پەسند کردن بدا و لە نامەیەکیش دا کـــە بە بۆنەی گۆیا پیرۆزبایی کونگرەی پێنجەمەوە ناردبووی داوای کردبـــوو کە حیزب " تصفیە" بکات ٠

بە جێ هێشتنی نیشتمان و چوونە نێو خاکی عیراق و ژێر سێبـــەری حکومەتی بەعسی" هاوخەندەك" هەلی بۆ دوکتور قاسملو رەخساند کـــە کونگرەی شەش سازبدا و بە هەزار پینەو پەرۆ و زبز بوون و گریانـــــی ماستاوکەر و هەرەشەی کشانەوە لە حیزب و فرو فیڵی بژاردن " کورتـــە باس " بسەپێنێ ٠ " کورتە باسیك هیچ یەك لە ئەندامانی کومیتـــەی ناوەندی پێش بلاو کردنەوە نەیانخوێندبوّوە و لە پلینومی " ئالان " دا کوێر کوێرانە بۆیان لە ملی داو بلاو کرایەوە٠

لەراستی دا ئەگەر کونگرەی چوار سەرەتای سەپاندنی دیکتاتـــوری و خۆ پێوە هەلاوەسینی چەند کەسیکی بوودەلە و چاپلوس بوو(١)٠

---

(١) دیارە ئەم تەعریفە ، تەواوی ئەندامانی هەلبژیردراوی کونگرەی چـوار ناگریتەوە٠ بەلام چەند کەسیکی کومیتەی ناوەندی و دەست و پیوەندەکانی خوارو و دەوروبەری دەفتەری سیاسی پر بە پیستی یەتی ٠

کۆنگرەی شەش سەرەتای لادان لە رێبازی پێشکەوتووخوازانـــەی ٤٠ ساڵەی حیزبی دیموکرات و کەوتن بە لای سوسیال دیموکراسی و بە قسەی یەکێك لە بەشدار بووەکانی کۆنگرە " نشاندانی چرای سەوز بەئەمریکا "و دوور کەوتنەوە لە هێزە دیموکرات و پێشکەوتووخوازەکانی ئیرانی بوو٠

سەرەتای گۆرینی پرۆگرامی حیزب و رێبازی سیاسی جولانـــــەوەی کوردستانی ئیران بوو٠

ئەو کەسانەی کە ئێستا ناوی " رێبەرایەتی شۆرشگێر " یان لـــــە خۆ ناوە ، دار دەستی ئیجرای ئەو سیاسەتەو سوێند خۆرو پشتگـــــری " کورتە باس " بوون ٠

کونگرەی شەش بێجگە لە لادانی رێبازی پێشکەوتووخوازانە دەکـرێ بیژێن سەرەتای قەیران و نزمی پلەی ئەخلاق و مرۆڤایەتی رێبەرانــــی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو٠ دەرکردنی ئەندامانی خـاوەن بیروباوەر پێشکەوتوخوازانە و لایەنگرانی رێبازی سوسیالیزمـــــی عیلمی " تعهد " وەرگرتن بە شێوەی ساواك ، برسی هێشتنەوەی مال و مندالی کادرو ئەندامی حیزبی و پێشمەرگە ، ئەو پەری نزمی پلـــــەی ئەخلاقی ئینسانی رێبەرانی ح٠ د ٠ ك ٠ ا ، بوو٠

ئەوەی کە " ریبەرایەتی شورشگیر " لە بارەی " لادان و رویشتـــن بەرەو ئیمپریالیزم " باسی دەکەن ، لە کونگرەی شەشەوە سەری هەڵداوە و پەرەی گرتوە و ئەوانیش هەڵبژیردراوی ئەو کۆنگرە و سوێند خۆری بـــوون و تا رۆژەکانی ئاخری کۆنگرەی هەشتیش پشتیوان و بەریوە بەری بوون٠

سووکە سەفەری ئوروپا و شەش مانگ رابواردن لە پاریس بە نـــاوی نوێنەر ، بەرتیلی بێدەنگی و زمان گرێ دان و پشتگیری کردنی ئـــــەو سیاسەت و ریبازە چەوتە بوو٠ بەلام داخوا لەو ١٥ کەسە کە ئێستا بـوون بە " شورشگیر " یەك هەبوو جاریك بیژی :

کابرای زمان نەزان و نەشارەزا لە پاریس بە شەش مانگ چی فیر دەبـێ و

چ بو حیرب دەکـــا ؟

ئەو کاتەدا کە ئەندامی دەفتەری سیاسی لە سەفەری نوێنەرایەتـــی تەش مانگەدا ١٤٠ هەزار فرانکی لە هەقی فیر بووی زمانـــــی ئینگلیزی دەدا . پێشمەرگەی برێنداری حیزبی لە پاریس بۆ سیعــــار موحتاج بوو . لە گەرانەوەش دا بۆ کوردستان بە تاوانی ئەوە کە چۆتـــە مالی عەزیزی ماملێ ، ئاغای سادقی شەرەفکەندی هەڵی پێچابــــوو حیسابی لێ دەکێشــا .

دوکتور قاسملو هەر ئەوەی دەویست و گەرەکی بوو ئەو جورە کەسانە لە دەوروبەری بن . سیمون لیس لە کتیبی " جلە نوێیەکانی پریزیدنت مائو " دا دەڵێ : " کاتێك حوکمرانە دیکتاتورەکان لە کۆتایـــی تەمەنیان وە نیزیك دەکەون ، ئیرەیی و دڕدۆنگی و ترس و بەدگومانـــی رۆریان بۆ دێنێ . ئەو دەم کەسانی لێ وەشاوەو تێکوشەر وەلا دەنێن و پشت بە کەسانی خزمەتکارو بوودەڵە و نەزان و دوورروو و زمانلـــوس دەبەستن " .

دوور بێ لە دوکتور قاسملو لە باری تەمەنەوە ، چونکە خوا نەکـــا ، ئیتر کەس نامێنی بۆ دیموکراسی و پلورالیزم خەبات بکا ، بـــەلام وتەکانی تر راست و پر بە پێستی ئەو ٩ سالەی رابردوون کە باسیان کرا .

کاتێك دەفتەری سیاسی لە ناوچەی گەورکان لە " دۆڵی دیموکرات" ـوو چوومە لای دوکتور قاسملو لە بێ سەرەو بەرەیی تەشکیلات و بـــێ ـەرمی و بیکارەیی هەندێ کادر و بەرپرسی تەشکیلاتەکان وە دەنگ هاتـــم ـە وەلام دا گوتی

ئەوەی دەیلێی راستە . بەلام چ بکەم عیلاج نیە . خۆ کادر دروست ناکرێ . کادرە لاو و ژیرەکان هەموو لەگەڵ تاقمی حەوت کەسە رۆیشتن . هــــەر ئەوانە ماون"

ـە کاتێکا وا ـەبوو ـاسی ـەدەکرد . دەکرا ئالوو گۆر پێك بێنـــێ .

بەلام کەساني ئەوتۆی گەرەك بوو بە قەولی زانای بەنا و بانگی کورد ماموستا مەلا حوسینی مەجدی : " هەر گوێ بن زمان تەبن " • ئەو نەیدەویست ئەندامی لێ زان و بە زیپك و زاگون کاری حیزبی بگرنە دەست •

نامەی رەخنەو پێشنیاری کادر و ئەندامانی حیزبی دەکرانە دەستە چیلەی ئاگر هەلکردن • سادقی شەرەفکەندی لە وەلامی سکالاو رەخنە و پێشنیاری ئەندامانی حیزب دەیگوت :

" باشە نامە زۆر دێن ئاگریان پێ هەلدەکەین • ئەو نامانە نەبن گورەمان بۆ داناگیرسێ " •

ڤیزو لە خۆبایی بوونی رێبەرایەتی حیزبی دیموکرات وای لێ هاتبوو ئیتر وەلامی رەخنەو پێشنیار و سکالای کادرو ئەندامانی حیزب نەدەدراوە •

قسەکانی لینینی مەزن وەراست دەگەران کە دەیگوت :

" تەواوی ئەو حیزبە شورشگیرانەی کە تا ئێستا فەوتاون ، لەبەر ئەوەبوە کە رێبەرەکانیان لە خۆ بایی بوون و تووشی ڤیزو غەرەیی بوون و هێزو توانا و کانگای ذەخیرەی خۆیان لێك نەداوەتەوە و لە رەخنە ترساون " •

رێبەرایەتی ح • د • ك • ا ، جورێك تووشی ئەو نەخوشی یە ببوو کە ئێستاش شەقی زەمانە نەیتوانیوە لەو نەخوشی‌یە رزگاری بکاو وەك رێبەرایەتیەکی ساغ و سەلیم بروانێتە رووداو وکارەساتەکانی ئەوروی کوردستان •

پاش کونگرەی شەش کە رێبازی سوسیال دیموکراسی حیزبی دیموکراتی تووشی قەیران و گەندەلی کرد بە دەیان کادری لێ هاتوو ، پێشکەوتووخواز و پێشمەرگەی فیداکار رێبەرایەتیان بە جێ هێشت و دانیشتن لە رۆژنامەی کوردستان دا دەیاننووسی " حیزبەکەمان بە رۆیشتنی ئەوانە بەهێز بوە • " !

لەبەر سیاسەتی چەوت و لێنەزانی " فەرماندەی گشتی " کە رۆژێك نەیزانیوە چەخماخی تفەنگ هەلپچڕێ سەدان پێشمەرگە دانیشتن و یا تەسلیم بوونەوە • بەلام هێشتا سکرتیری حیزب لەوتوویژی چاپەمەنی دا دەیگوت : " ١٢ هەزار پێشمەرگەمان هەیە " • ئەوەلەکاتێکا کە لە ولاتی خۆی جێگای حاوانەوەی نەمابوو ، بە ناچاری خۆی دابوە بەر سێبەری ریژێمی بەعس •

دیارە بەداخەوە فیشال و فریو دان لە کوردستان وا بۆتە باو ، جێگای راستی گرتۆتەوە •

سەیر ئەوەیە ئێستا کە ئەو لەت بوون و جیا بوونەوە زیانیکی گەورەی بە حیزبی دیموکرات و بە جولانەوەی رزگاریخوازی کورد گەیاندوە و ناحەزەکانی دیموکرات سەمای پێوە دەکەن و قەل و دال سەریان لێ دەسوێ ناوە ، چاپەمەنی سەر بە دوکتور قاسملو دەنووسن : " بە رۆیشتنی ئەوانە حیزب بە هێز بوە و پاك بۆتەوە " ! نەك هەر ئەوە ئەو کەسانەی کە تا دوێنێ هاوکاری دوکتور قاسملو بوون و بە گوێرەی نووسراوەی خۆی " پێ یان هەلگوتوە و بە پشتیوانی و هاوکاری ئەوان حیزبی دیموکراتی تووشی ئەو رۆژە کردوە و جوولانەوەی کوردی لە کوردستانی ئیران بەم دەردە بردوە ، بە " جاش و خاین و ترسەنۆك و تەمبەل و بێکارەیان " ناو دەبات • ئەم شێوە هەلوێست و بۆ چوون و سیاسەتە دزێو و چەپەلە رەنگە هەر لە کوردستان و لە نێو ریکخراوەکانی کوردستانیدا باو بێ کە لە گەلکوو ناکۆکی سیاسی و ئیختلافی بیرو راو بۆ چون پەیدا بوو ، ئیتر بوختان و تومەت و نێو و نرتکەی دزێوو درۆ بۆ یەکتر هەلدەبەستن و ئەگەر دەستیان بروا ، گرتن و حەپس و تەنانەت کوشتنیشی لێ زیاد دەکەن • ئەم ئاکارو هەلوێستە دزیوە لە کوردستان نرخی سیاسەتیشی دابەزاندوە و ئیتر کۆمەلانی خەلکیش بۆ ئەو بەیت و باوە تەرە ورد ناکەن•

دەرس وەرگرتن لە رووداوەکانی مێژوو دەبوایە سەرمەشق بێت٠ ئەوەندە ئەم جۆرە تۆمەت و بۆختانە بۆ دوکتور قاسملو هەڵبەستراون و تەنانەت کردوویانەتە بریاری کۆنگرەش لە رابردوودا ، ئیتر نەدەبوایە ئەو بە هیچ جۆر ئەم شێوە بۆختان و تۆمەتە بە درۆیانە وەپاڵ هاوکارانی خۆی و ئەندامانی حیزب بدا ٠

ئەم هەویرە ئاو زۆر هەڵدەگرێ ٠ چوونە نێو قوولایی کاراکتەر و خاسیەتی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و سیاسەت و بۆ چوونیان بۆ بیرەوەریەکانم دێڵمەوە و ئەو باسە لێرە دا کوتایی پێ دێنم و بە کورتی چەند دێریك لە سەر کۆنگرەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران پاش ١٩٧٩ دەنووسم ٠

## " کۆنگرەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران"

ڕێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستان گەلێک شانازی بەوە دەکات کە لە کاتی خۆیدا کۆنگرە دەبەستی و ئەوەش بە نیشانەی دیموکراسی و ژیری و وریایی ڕێبەرایەتی دادەنێ. دەیەوێ وا نیشان بدا چونکە لە کاتی خۆیدا لە دەرەوەی ولات کۆنگرە دەبەستێ و خەلك کۆ دەکاتەوە، لە چاو ئەو هێزانەی کە گۆیا کۆنگرە نابەستن، ملی فیلیان شکاندوە![1]

پێك هێنانی کۆنگرەی حیزب بۆ لێکۆڵینەوەو شی کردنەوەی بار و دۆخی خەبات و ئاور دانەوە لە تێکۆشانی ڕابردوو، چاو گێڕان بە کەم و کۆڕی و هەڵەکاندا، کارێکی جوان و پەسندە.

بەلام کۆنگرەی حیزب تەنیا بۆ کۆ کردنەوەی ئەفرادو بۆ پروپاگاندە نابەسترێ. هەر بۆیە نیە چونکە لە پروگرامدا کات بۆ پێك هێنانی کۆنگرە دیاری کراوە. حیزبێکی کە لە هەل و مەرجی نهێنی دژواردا خەبات بکا کاتێك کۆنگرە دەبەستێ کە بارو دۆخێکی تایبەتی هاتبێتە پێش، بخوازی تاکتیك و ستراتیژی تازە دیاری بکا یا شێوەی خەبات و تێکۆشان بگۆڕێ و کۆنگرە یارمەتی بە پەرە گرتنی جولانەوەو یەکیتی ریزەکانی حیزب بکات. ئەگەر بە وردی و بە بێ عەرەزانە لە کۆنگرەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ورد بینەوە. لە کونگرەی چوارەوە هیچیان لە هیچ بارێکەوە، نە لە باری ئیدیولۆژی نە لە باری سیاسی و

نە لە باری نیزامی و نە لە باری پتەو بوونی ریزەکانی حیزبـــــەوە یارمەتی‌یان بە پەرە گرتن و سەرکەوتنی جولانەوەو بردنە پێشی سیاسی نەکردوە٠ هەموویان بۆ ئامانجی تایبەتی ، بۆ ئالو گۆر کردنـــــی مۆرەکانی شەترەنج و بۆ سەپاندنی دیکتاتۆری بەستراون ٠

کۆنگرەی چوار کە سەرەتای هلوّل بوون و لەرزۆکی یەکیتی حیـــزب و سەپاندنی سەرەرۆیی تاقە کەسە بوو ، بە کورتی باسمان کرد کە بۆچـــــی بەسترا و ئەنجامیشی چ بوو٠

کۆنگرەی پینج بۆ ئەوە بەسترا کە جیگای حەوت (٧) کەسەی رۆیشتوو بە کەسانی ناشارەزای سیاسەت و گوێ لە مست پر بکریتەوەو چوونـــــی نیو شۆرای بەرگری میللی کە هیچ یەك لە بەشداربوەگانی کۆنگـــــرە نەیاندەزانی چی‌یە بیسەپێنن ٠ هەروەها بە بێ لیکدانەوەی وردی سیاسی‌و زانستی و هەلسەنگاندنی هێزو توانای خۆیی و دووژمن ، خۆ بکەنـــــە کەوا سووری بەر لەشکرو درۆشمی رووخانی ریژیمی خومەینی بەرز کەنەوە

کونگرەی شەش تایبەتی بۆ ئەوە بەسترا کە حیزبی دیموکرات لـــــە ریبازی پێشکەوتووخوازانەی چل (٤٠) سالەی خۆی لا بداو بەرنامـــەی سۆسیال دیموکراسی پەسند بکاو ریگا بۆ چوونە نیو ئینترناسیۆنالـــی سۆسیالیستی و رۆیشتن بەرەو رۆژئاوا خۆش بکا ٠ هەر لەو کاتەشـــدا حیزبی دیموکرات وەك ئاغای مەسعودی رەجەوی داوای کردبوو لـــــە کادرو ئەندامانی خاوەن بیرو باوەری پێشکەوتووخوازو دژی ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی و لایەنگرانی سۆسیالیزمی عیلمی " تصفیە" بکا ٠

لە راستی دا نووسین و سەپاندنی " کورتە باس " هەر بۆ ئەوە بـــوو کە خۆیان لە لای سۆسیال دیموکراسی و هێندێ حکومەتی سەرمایـــەداری رۆژئاوا خۆشەویست بکەن ٠ دیارە هەل و مەرجیکی لە باریان بـــــۆ ئەو کارە هەلبژاردبوو ٠ دوکتور قاسملو لە وەلامی رەخنـــــــەی " شەخسیەتیکی کورد "دەسبارەت بە رەوتی کۆنگرەی شەش و نووسینـــی

کورنه باس و سەپاندنی لە کۆنگرەدا ، گوتبووی: " ئەگەر راست لەو کات و هەل و مەرجە دا ئەوەم نەکردبایە ، جەو سازی لێ پەیدا دەبوو" .

دوکتور قاسملو راست دەکا . ئەگەر لە کوردستانی ئیران، لە نێو کۆمەلانی خەلك ویستبای ئەو بەزمە ساز بکا ئەنجامی جۆرێکی دیکە دەبوو. دەنا زۆر باش دەیزانی کۆنگرەی شەش بۆ جولانەوەی کوردستانی ئیران و بۆ حیزبی دیموکرات نەك هەر سەرکەوتنی تێدا نەبوو بەلکو ترازیدیش بوو .

سەیر ئەوەیە پاش هەموو کۆنگرەکانیش بە بێ جیاوازی نووسیویانە: " ئەو کۆنگرەیە سەرکەوتووترین کۆنگرە بووە لە مێژووی حیزبدا ".
راگەیاندنی کۆمیتەی ناوەندی بە " رێبەرایەتی شورشگێر"ی ئێستا شەوە پاش کۆنگرەی شەش دەلێ : " کۆنگرەی شەش دەبێتە قوناخێکی گرێنگ لە ریگای خەباتی حیزبەکەماندا ... بێگومان کۆنگرەی شەش لە ژیانی پر لە هەورازو نشێوی حیزبەکەماندا هەنگاوێکی گرێنگی مێژوویی یە بەرەو پێش بەرەو وەدی هێنانی ئاواتە پیرۆزەکانی کۆمەلانی خەلك و بەرەو دابین کردنی دیموکراسی بۆ ئیران و خودموختاری بۆ کوردستان " .

ئێستا ئەندامانی حیزبی دیموکرات حەقیان نیە پرسیار لەو کەسانە بکەن کە چەند سالە بە قسەو بە فیشال مێشکی خەلکیان پر کردوە کۆنگرەی شەش کام " هەنگاوی مێژوویی " بەرەو " وەدی هێنانی ئاواتە پیرۆزەکانی کۆمەلانی خەلك " هاویشتوە ؟

هەر ئەوە نیە کە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی هەلبژێراوی کونگرەی شەش لە نامیلکەی " وەلامی فیتنەگەران " دا دەنووسن : " لە تەواوی سالەکانی رابردوودا فراکسیۆنی ناوبراو ( مەبەست دوکتور قاسملو و دوکتور شەرەفکەندی ) بە رێبازی رێك کەوتن لەگەل سۆسیال دیموکراسی سیزیکی لەگەل ئیمپریالیزم بە تایبەت ئیمپریالیزمی ئەمریکایان گرتوتە پێش ".

نازه با ئەوانیش ئەوه نەنووسن ٠ چونکه تا کۆنگرەی هەشـــت(٨) خۆشیان لەو سیاسەت و ڕێبازەدا بەشدار بوون٠ بەلام بۆ ئەندامان و بـــۆ کۆمەلانی خەلکی کورد باش روون بۆتەوە کە کۆنگرەی شەش گەورەتریـــن زیانی بە حیزبی دیموکراتی کوردستان گەیاندوە کە وا ئێستا بەرهەمەکەی دیتە دی ٠

ئێمە لە نامیلکەی" تایبەتی کۆنگرەی شەش ژانویەی ١٩٨٥" بـــە درێژی نێوەرۆك و چۆنیەتي کۆنگرەی شەشمان شی کردوٚتەوەو پێویـــست بە وەرد دانەوەی ناکا ٠

کۆنگرەی حەوتیش (٧) کە بە کۆنگرەی مردوو و زاربەستان ناســراوە بۆ باسکردن نابێ و خۆشیان نازانن قازانجی بۆ حیزب چی بوە٠ بــەلام دەکرێ بە کورتی باسێکی کۆنگرەی هەشت (٨) بکەین و نیشانی بدەیــن کە ڕێبەرایەتی حیزبی دیموکرات چۆن بە ئاوەژوو کردنەوەی وشەو زاراوی زانستی گالتە بە هۆش و بیرو چارەنووسی ئەندامانی حیزب دەکا ٠

با سەیرێکی وشەو ڕستەکانی بەیاننامەی کۆمیتەی ناوەندی حیزبـــی دیموکراتی کوردستان بکەین کە بە بۆنەی کۆتایی پێ هێنانی کۆنگـــرەی هەشتەوە بلاو کراوەتەوە٠ لە بەیاننامەکەدا دەلێ : " پێك هێنانـــــی کۆنگرەی هەشتی حیزب و بە جێ گەیاندنی کارەکانی ، هەم نیشانـــەی توانای حیزبە لە هەل و مەرجی دژواردا ، هەم ئەو ڕاستیەش جارێکی تـر روون دەکاتەوە کە حیزبی ئێمە چەندە بروای بە دیموکراسي و ئەسلەکانـی دیموکراتی نێو حیزبی هەیە ٠٠٠ بە پێك هێنانی کۆنگرە قۆناخێکـــی گرینگی تازە بۆ بەجێ گەیاندنی ئامانجی دیموکراسی لە ئێـــران و خودموختاری بۆ کوردستان لە خەباتی حیزبدا دەست پێ دەکرێ" ٠

ئێمە کاتی خۆمان بە لێکدانەوەی نێوەرۆکی بەیاننامەکە ناگرێــن کە بە وشەو زاراوی قولومبەو عەوام فریوانە رەشکراوەتەوە٠ تەنیـــا ئەوەندە دەلێن . داخوا لەت بوونی حیزب و ساز بوونی هەراو کێشـــە و

دووبەرەکی " قۆناخی گرینگی تازەیە بۆ بەجێ گەیاندنی ئامانجی دیموکراسی بۆ ئیران و خودموختاری بۆ کوردستان " ؟

داخوا ئەوەی ئەورۆ بە سەر حیزبی دیموکرات و بزوتنەوەی کورد لە کوردستانی ئیراندا هاتوە ، دەکرێ بە " دیموکراسی " بدرێتە قەلەم؟

داخوا پیکهینانی کۆنگرە لە دەرەوەی و لاتی خۆت بە کۆ کردنەوەی هێندێ پێشمەرگەو ئەفرادی لێ قەوماو و دەربەدەری دەورەی دەفتەری سیاسی ، نیشانەی " دیموکراسی و وریایی حیزبی یە " ؟

نمونەی زۆر ئاشکرای دیموکراسی لە حیزبی دیموکراتیدا ، هەڵبژاردنی نوێنەری ئوروپا بوە بۆ کۆنگرەی هەشت • لە کۆنفرانسی حیزبی بە زۆربەی دەنگ ئەندامیك بە نوێنەر هەلدەبژێردرێ ، بەلام دەفتەری سیاسی لە دەمی کۆنفرانس دەداو ئەندامی هەلبژێردراو بۆ کۆنگرە قبول ناکا • ئەوەیە دیموکراسی لە " کور تە باسی " حیزبی دیموکرات دا • سەیر ئەوەیە ئەوانەی ئێستا بوونە " شۆرشگێر " و ئەوانیش دەم لە دیموکراسی دەکوتن ، چەند کەسیان ئەندامی دەفتەری سیاسی بوون •

تا کەی دەبێ لەم کوردستانە چەند کەسی سەوداگەری سیاسی بە وشەو زاراوەی قولومبە خەلك فریو بدەن و لە سەر حیسابی خوێنی رۆلەکانی گەلێ ژیان بەرنە سەر ؟!

ئەگەر تەماشای راپۆرتی کومیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی هەشت و گۆرینی پێشەکی بەرنامەی حیزبی دیموکرات بکەین ، ئەم قۆناخەی کە بەیاننامەی کومیتەی ناوەندی باسی دەکاو چەند سالە سکرتێری حیزب هەولی بۆ داوەو جولانەوەی کوردستانی ئیرانی لەسەر گیراوە گەیوەتە جێ • ئەویش بریتی‌یە لە سرینەوەی وشەو ناوی ئیمپریالیزمی ئەمریکا لە راپۆرت و لە پێشەکێ بەرنامەدا • هەروەها لە یەك ریز دانانی ولاتانی سوسیالیستی‌و سەرمایەداری لە لیکۆلینەوەدا •

به‌لام واش نیه به گه‌یشتنی ئه‌م قۆناخه دوکتور قاسملو حه‌سابێته‌وه‌و پالی لێ بداته‌وه ٠ ئه‌و بۆ فریودانی به‌شداربوه‌کانی کۆنگره باسی پێوه‌ندی له‌گه‌ل و لاتانی سۆسیالیستیش ده‌کات ٠ داخوا هیچ یه‌ك له ئه‌ندامانی کومیته‌ی ناوه‌ندی و به‌شدارانی کونگره‌ی هه‌شت پرسیاریان کرد کام پیوه‌ندی ؟ پێوه‌ندی له‌گه‌ل کام و لاتی سۆسیالیستی ؟

بان کاتیك سه‌فه‌ری خوی بۆ ( لیما ) بۆ به‌شداری له کۆنگره‌ی ئینترناسیونالی سۆسیالیستی که تازه رێگاشی ناده‌ن له‌وێ نه قسه بکاو نه باسی کورد بێنیته گۆرێ له راپۆرت دا به سه‌رکه‌وتنی داده‌نێ که‌س هه‌بوو بلێ : کام سه‌رکه‌وتن ؟ ئه‌و سه‌فه‌ره بێجگه له سه‌یرو سه‌فای سکرتیر له ئه‌مریکای لاتین چی بۆ کوردو بۆ حیزبی دیموکرات تیدا بوو ؟

به جوانی ده‌رده‌که‌وێ ئه‌و کۆنگرانه هه‌ر یه‌که بۆ مه‌به‌ستێکی ناره‌سه‌نی تایبه‌تی گیراون ٠ هه‌ر وه‌ك گوترا کۆنگره‌ی شه‌ش بۆ ئه‌وه‌گیرا که جاده‌ی به‌ره‌و سۆسیال دیموکراسی و رۆژ ئاوا پاك بکاته‌وه که بوو به هۆی لاواز بوونی بزوتنه‌وه‌و هاتنه خواری پرستیژی حیزب٠ به خۆرایی نیه پاش تۆپینی کورته باس که چوار سالی به سه‌ر دا تێ په‌ریوه نه‌ك هه‌ر جاریکیش له ئه‌ده‌بیاتی حیزبی دا باسی نه‌کراوه‌و ناوی نه‌هاتوه، به‌لکو جارو بار له په‌ناوه ویستوویانه حاشای لێ بکه‌ن و به سۆیند و پاکانه گۆیا خۆ له رێبازی سۆسیال دیموکراسی دوور خه‌نه‌وه٠ به‌لام ئیستا له کونگره‌ی هه‌شت جاریکی تر دوکتور قاسملو ویستوویه به ئاواژو کردنه‌وه‌ی زاراو و گۆته‌ی زانستی " سوسیالیزمی دیموکراتیك" و " دیموکراسی سۆسیالیستی " بکات یه‌ك و وا نیشان بدا که گۆیا ئه‌وه‌ی چه‌ند سال پێش ئه‌و فه‌رموویه‌تی هه‌ر ئه‌و شته‌یه که ئیستا گۆرباچۆف ده‌یلێ ٠

به‌لام داخوا که‌س هه‌بوو له رێبه‌رانی " ناشورشگێری ئه‌و ده‌م " و شورشگێری ئیستا " بلی کاکه که‌لـه‌گاییش راده‌و ئه‌ندازه‌یه‌کی هه‌یه٠

سۆسیالیزمی دیموکراتیك كە ریبازو تیئوری بۆ چوونی " سوسیال ـ دیموکراسی و ریفۆرمیستی " یە ، لەگەل دیموکراسی سۆسیالیستی عەرز و عاسمانی فەرقەو بە هیچ جور نابنە یەك ٠

داخوا کەس هەبوو بلیّ : گوربا چوّف باسی دیموکراسی سوسیالیستی دەکاو دەلیّ : " پیشکەوتنی ولاتمان بیجگە لە چوارچیوەی سۆسیالیزم هەر بە خەیالیشمان دا نایە "٠ واتە چوارچیوەی سوسیالیزمیك کە لەویدا چەوسانەوەی فەرد بە دەستی فەرد لەبەین چوەو ریگای نیە٠ ئەوەش لەگەل سۆسیالیزمی دیموکراتیکی تۆ و سۆسیال دیموکراسی رۆژئاوا کە بناغەکەیان لە سەر چەوسانەوە دامەزراوە ، فەرقی زۆرە٠

شی کردنەوەی راپۆرتەکانی کومیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران بۆ کونگرەکانی حیزب لەم کورتە نووسینەدا جیی نابیتەوە ٠ ئەرکی ئەندامانی حیزبە بە وردی لیّ یان بکوّلنەوەو لە سیاسەتی بەریوەبەرایەتی حیزب ئاگادار بن ٠

## ٢ـ هۆی جیابوونەوەی بەشێك لە ڕێبەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران و بەیاننامەی دە (١٠) مادەیی ٠

بەر لە هەموو شت دەمەوێ رابگەینم بە پیچەوانەی بۆ چوونی ئەو کەسانەی کە جیابوونەوەو لەت بوونی هێزەکانی کوردیان پێ کاریکی ئاسایی یەو بە لەت بوونی حیزبی دیموکراتی کوردستانیش هەڵ دەپەرن ، من جیا بوونەوەو ساز بوونی کەرت و دەستەی بچووك و ناکۆکی و شەرە دندووکە بە زیانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد دەزانم ٠

بێگومان جیابوونەوەی ئەو بەشەی ئەندامانی حیزبی دیموکرات کە ناوی " ڕێبەرایەتی شۆرشگیر " یان لە خۆ ناوە ناکرێ بە ناکۆکی بیرو باوەرو بۆ چوونی سیاسی تاکتیك و ستراتیژی جیاواز دابنرێ٠ ئەوانە تا لە مانەوەی خۆیان لە دەزگای ڕێبەرایەتی دا ( وەك هەمیشە بە بەژنیان براێ) ناهومێد نەبوون ، نەگەیشتوونە ئەو بریارە کە واجیا بنەوەو حیسابی خۆیان لە حیسابی ڕێبەرایەتی هەلبژێراوی کۆنگرەی هەشت (٨) جیا بکەنەوە ٠ یا بە قەولی خۆیان " فراکسیۆنی قاسملو ـ شەرەفکەندی " دەر بکەن٠

لێرەدا لەوانەیە هێندێ پرسیار بۆ ئەندامانی حیزبی دیموکرات بێنە گۆرێ کە پێویستیان بە وەلام دانەوە هەیە٠

ـ داخوا ئەم بریارەو جیابوونەوە بەراستی لەبەر نەبوونی دیموکراسی و ڕێبازی چەوت و دیکتاتۆری و لادان لە پەیرەو و پرۆگرامی حیزب بووە؟

ـ داخوا " ڕێبەرایەتی شۆرشگێر " تا قۆناخی ئاخری هەلبژاردن و تا پاش کۆنگرەی هەشت هەستیان بەوە نەکردبوو کە دیموکراسی لە حیزبی دیموکرات دا پێ شێل کراوەو دیکتاتۆری خۆی سەپاندوە ؟

ـ داخوا تا پاش کۆنگرەی هەشت ئەوەیان نەدەزانی کە حیزبی دیموکرات

" لە نێو ئۆپۆزیسیۆنی شۆرشگێر تاق کەوتوّتەوەو لە دەرەوەی ئیرانیش سیاسەتی راستگەرایانە بوّتە کوّسپی دامەزرانی پێوەندی لەگەڵ ولاتانی سوّسیالیستی " ؟

بێگومان لەو پرسیارانە زوّر هەن و وەلامیان رەنگە زوّر شت بوّ کوّمەلانی خەلك روون بکاتەوە • هەر وەك لە پێشەوەدا باسکرا ، لە کوّنگرەی چوارەوە لە ژێر پەردەی دیموکراسی بە دروّدا ، دیکتاتوّریەکی تەواو بە پشت ئەستوری هێندی کەسی بێ شەخسیەت و زمان لوس و مەرایی کەر ، کە لە دەوری رێبەرایەتی کوّ ببوونەوە ، بە سەر حیزبی دیموکرات دا سەپێنرا •

دوکتور قاسملو بە زیرەکی توانی لە بارو دوّخی رەخساوی کوردستان و لە نەزانی و بوودەلەیی دەورو بەرەکەی کە بە ناوی کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی کوّی کردبوونەوە ، کەلك وەر گرێ و رێبازی چەوت و دیکتاتوّری خوّی بسەپێنێ • هەر لەو کاتەشدا هەر کاتیك ویستی وەك موّرەی شەترەنج ئالووگوّریان پێ بکات •

ئەو شێوە ناحەزو ناپەسەندە گەیشتە رادەیەك تەنانەت ئەو کەسانەی کە ماوەی هەشت سال لەبەر دەستی دا هەڵ دەسووران و سلاوەتیان لە دیداری دەدا ئەوانیش هەراسان بن و وەدەنگ بێن و حیسابی خوّیان جیا بکەنەوە • بەلام کەی ؟ وەلە پێناوی چی دا ؟

هەرچەند"رێبەرایەتی شورشگێر " لە بەیاننامەی دە(١٠) مادەیی و لە نامیلکەی " وەلامێك بە فیتنەگەری " دا ، ویستوویەتی رەنگی سیاسی و یاخودا نەخواستە ناکوّکی بیرو باوەری بە جیابوونەوە بدات ، بەلام زوّر روونە کە هوّی جیابوونەوە هیچ بنەمایەکی ناکوّکی سیاسی و بیرو باوەریی نیە •

دیسان باش بووە لە کوّنگرەی هەشتەم دا دوکتور قاسملو بە ئاشکرا گوتوویەتی : لیستە دلخوازی خوّم دەدەم و موّرەکان دەگوّرم و سوکەرو گوی

لەمسی سازە دینم و ساوی کومیتەی ساوضدیان لەسەر دادەنیم٠

بو چما لە کۆنگرەی چوار شەوی پێش هەلبژاردنی بەدزی چەند کەسی لە نوکەرو بەرەلای سیرمەخۆر کۆنەکردبۆوەو ساوی دلخوازەکانی خـــۆی لە لیستەیەك دا نەنووسیبوو . بەیانی رۆژی هەلبژاردن لات و سەر سەری بەنێو کونگرە وەرنەکردو لیستەیان بلاو نەکردەوە ؟

بەلام هیچ یەك لەوانەی کە ئێستا بوونە " شۆرشگێر " و ئەوانـــــی ئەو دەم " پێشکەوتووخواز " بوون ، چونکە ناویان دەلیستەکەدا هاتبـوو هیچ رەخنەیان نەگرت و وەدەنگ نەهاتن ٠

کۆنگرەی شەش کە سەرەتای لادانی حیزبی دیموکراتی کوردستانـی ئیرانە لە رێبازی پێشکەوتووخوازانەی چل سالەدا و بە قەولی نووسراوەی " رێبەرایەتی شورشگێر " سازانە " لەگەل کۆرو کۆمەلە ئیمپریالیستە- کان و دوورکەوتنەوەیە لە بەرەی شورش " لەو کاتەوە دەستی پێ کردوە٠ بەلام داخوا برادەرانی " رێبەرایەتی شورشگێر " یش هەتا ملان لـــە نێو ئەو زەلکاوەدا نەبوون ؟

داخوا جاریکیش دژی ئەو " سازان " و رێبازی " کورتە بـــــاس " وەستان ؟ یان ماوەی چوارسال بە دل و بە گیان و بە سوێند لە رێبـازی چەوتی کونگرەی شەش دا تێکۆشان و بیری شۆرشگێری و پێشکەوتـــوو- خوازانەیان فیدای سەفەری ئوروپاو نوێنەرایەتی شەش مانگەی پاریـــس کرد؟

لە نووسراوەکانی " رێبەرایەتی شورشگێر " وادەردەکەوێ کە هەتـــا ەتیجەی هەلبژاردن و ساهومێد بوون لە هەلبژاردنی خۆیان لە کونگـرەی هەشت دا . ساتەبایی و ساکۆکیەکی ئەوتۆیان لە بۆچوونی سیاســـی و رێبازو بیرو باوەردا لەگەل بە قسەی خۆیان " فراکسیۆنی قاسملـــو . شەرەفکەندی " سەبووە چونکە داوا کردنی کۆنگرەی " لە نۆرەبەدەریش " بو چارە سەرکردنی مەسەلەی سیاسی و راستکردنەوەی سیاسەتی چەوتـــی

حیزب نەبووە ، بەڵکو بۆ هەڵبژاردنەوەی سەرلە نوێ و گەرانەوەی ئەوان بۆ کومیتەی ناوەندی بوە ٠

لە بەیاننامەکەدا گوتراوە : " زۆربەی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لە پلینۆمی پێش کۆنگرەی هەشت و لە رەوەندی کونگرەشدا دوارۆژی دژوار و نالەباری ئەو شێوە هەڵبژاردنمیان چەند جار وەبیر خستەوە" ٠ لێرەدا بە جوانی دەردەکەوێ کە بنەچەکەی ناکوکی و کێشەو هەرا لە سەر "شیوە هەڵبژاردن " و هەوڵ دان بۆ کورسی ئەندامەتی کومیتەی ناوەندی بوە ٠ چونکە ئەگەر وەك خۆیان دەلێن زۆربەی کومیتەی ناوەندی لەسەر رووداوە باسکراوەکانی بەیاننامە لەگەڵ " فراکسیون " یەك نەبان و دژ وەستابان، ئیتر دوکتور قاسملو نەیدەتوانی ویست و بۆچوونی خۆی بەسەر حیزبدا بسەپێنێ ٠

لە بەیاننامەکەدا دەنووسن : " لە سەرانسەری ئەو ماوەیەدا ، واتە لە ماوەی ٩ سال دا دوکتور قاسملو بێ سرنج دان بە ئامانجە بەرزەکانی حیزب و بەرژەوەندییەکانی بزوتنەوەی میللی دیموکراتی ( **نەك رزگاری - خوازی !** ) هێندیك سیاسەتی لە نیّو حیزب و لە دەرەوەی حیزبدا بەرێوە بردووە کە ئامانجی دوارۆژیان لەو سیاسەتەدا سازان لەگەڵ کۆرو کۆمەلە ئیمپریالیستیەکان و دوور کەوتنەوە لە بەرەی شورش چ لە رادەی ئیران و کوردستان و چ لە رادەی جیهانی دا بووە" ٠

دیارە لە ماوەی ئەو ٩ سالە دا زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئێستا ئەو قسانە دەکەن ئەندامی کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی و جێگر و موشاویر بوون ٠ بێجگە لەوە وشەو زاراوەو مەتلەبەکانی بەیاننامە ،وەك " سیاسەتی سازان و بەرەی شورش و لادان و ئوپوزیسیونی ئینقلابی و ٠٠٠ هتد " روون نین و بەسەریاندا تێ پەریون ، بەلام ئەندامانی خاوەن بیر و باوەری حیزبی هەقیانە بپرسن :

ــ ئەدی ئێوە وەك ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی

چکارە بوون ؟ دەوری ئێوە لە ریبەرایەتی حیزبی دا چ بوە؟ چۆن ماوەی ٩ سال سکرتێری حیزب " بە رێنوینی سەعید بدڵ " ئەوەی بە سەر حیزب و جولانەوە هێناوە کە ئێستا ئیقراری پێ دەکەن و دانی پێ دادەنێن ؟

لە بەیاننامەکەدا گوتراوە : " لە هەر قۆناخێك دا بە بیانویەك " فراکسیۆن " دەستی کردوە بە پا لاوتنی بێجێ و بێ مانا لە نێو خۆی حیزب دا کە لە ئاکامی ئەو پا لاوتنانەدا ژمارەیەکی بەر چاو لە ئەندامانی وشیارو خەباتگێر پاسیڤ بوون و یان لە حیزب دەر کراون"!!

کارمان بەوە نیە کە هەرچەندە ئەوانەی ئەو ئیقرارە دەکەن بوونە " شورشگێر " ، بەلام ئێستاش نەیانویستوە یان نەیان وێراوە بلێن " ئەندامانی وشیارو خەباتگێر " لە سەر بیرو باوەری پێشکەوتنخوازانە و شۆرشگێرانە دەرکراون . بەلام دیسان ئیقرارێکی باشەو ئەم پرسیارەشی بەدوادا دێت :

داخوا ئەندامی حیزب بە تاقە کەسێك دەردەکرێ یا دەبێ ئۆرگانێك بە تایبەت ئۆرگانی سەرو بریاری لەسەر بدا ؟

داخوا لەو ئەندامانەی کە لە حیزبی دیموکرات دا بە تاوانی بیرو باوەری پێشکەوتوخوازی و دژی ئیمپریالیستی و لایەنگری لە رێبازی سۆسیالیزمی عیلمی دەرکراون کامەیان دەنگی ئەو " شورشگێرانە"ی ئێستایان لەگەڵ نەبوە ؟

داخوا ئەوانە وەك ئەندامی دەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی کەی لە دژی دەرکردنی ئەو ئەندامانە بوون و دژی پێ شێل کردنی پێرەوی نێو خۆی حیزب وەستاون ؟

داخوا لە دەرکردنی ئەندامان و لە ژێر پێ نانی ئوسولی حیزبی دا ، ئەوانەش شەریك و هاو دەنگ نەبوون ؟

داخوا دژی ئەو سیاسەتە خۆیان مات نەکردوەو ئیعتیرازیان گرتوە؟ لام وایە هەر بۆیەش وەبەر " تەصفیەهای بێ رویە" نەکەوتوون.!

هەر ئەندامی دەفتەری سیاسی نەبوو کە ئێستا بوّتە " رێبەرایەتی شوّرشگێر " لە جێگری کومیتەی ناوەندی و لە کادرەکانی حیزبی قەدەغە دەکرد کەنابێ هاتوو چوّی کەریمی حیسامی بکەن، مێشکتان تێك دەدا ؟

هەر ئەندامی دەفتەری سیاسی و بەرپرسی تەشکیلاتی حیزب نەبوو کە ئێستا بوّتە " شورشگێر " پسولەی دەرکردنی ئەندامانی تێکوٚشەرو خاوەن بیرو باوەری پێشکەوتووخوازیلە حیزب موّر دەکردو بوّ تێك شکاندنی ورەی کادرو ئەندامانی حیزب و وەفاداری بە رێبازی کورتەباس، بانگی ئەندامانی حیزبی دەکرد و دەیگوت : " داوەرە با موّریکت پێوە نێم " ؟

لە بەیاننامەکەدا یەکی تر لە ( دیاردەی رێبازی لادەرانەی فراکسیوّن) " مەیلی سازشکارانەو وتو ویژخوازانە لەگەڵ ریژیمی کوّنەپەرستی و دژی گەلی کوّماری ئیسلامی " دەست نیشان کراوە • هەر کەسێکی لەو ماوەیەدا نووسراوەکانی حیزبی دیموکراتی سەیر کردبێ ، رەنگە هیچی ئەوتوّی بەرچاو نەکەوتبێ کە حیزبی دیموکرات لە بارەی ریژیم و یا شەر دژی حکومەتی کوّماری ئیسلامی هەلوێستی خوّی گوّری بێ• دوور نیە " رێبەرایەتی شورشگێر " لەبەر خاتری خاتران و لەبەر پێ خوّش بوونی هێندێ لایەنی بێ سەلاحیەت مەسەلەی وتو ویژ لەگەڵ کوماری ئیسلامی - یان زێندوو کردبێتەوە • دیارە نووسراوەگانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران زوّر جار باسی " سەربەخوّیی دەکەن " بە بروای من ئیدیعای سەربەخوّیی حیزبیك یا رێکخراوەیەك کە لە ژێر رەحمەتی حکومەتیکی دوژمنی نەتەوەکەی خوّیدا ژیان بەسەر دەباو لەبارو دوّخێکی ئاوا نالەباردا خەبات دەکا ، پتر وەگالتە دەچێ تا راستی •

بەلام پیاو هەق بلێ حیزبی دیموکراتی کوردستان ، ئەگەر لە هیچ مەسەلەیەکدا سەربەخوّیی نەبووبێ ، لە مەسەلەی وتو ویژ لەگەل حکومەتی ئیراندا سەربەخوّیی نیشان داوە • جا ئەگەر ئەو هەنگاوە

بە تەنیا لە لایەن دوکتور قاسملوەوە هاویژرابێ . ئەو پەری سەربەخۆیی-یەو جیگای دەستخۆشانەیە. حیزبیك ئەشێ ئەوەندە غیرەت و سەربەخۆیی هەبێ ئەگەر كاریك بە راست بزانێ و بە قازانجی بزوتنەوە بێ ، بیكا و چاوەروانی پرس و فەرمان و ئیجازەی ئەم و ئەو نەبێ . وتو ویژ لە گەل دوژمن لە كات و لە بارو دۆخی خۆیدا ، نەتەسلیم بوونەو نە لە شۆرشگێریش كەم دەكاتەوە . نەك هەر ئەوە ، بلاو كراوەی موجاهید لە ژمارە ٢٦٧ ی خۆیدا ،٢٤ی رەزبەری ١٣٦٤ دەنووسی : " پیدا گرتنی حیزبی دیموكرات لە سەر پاراستنی مافی وتو ویژی سیاسی لەگەل ریژیم لە ژیر ناوی " سەربەخۆیی بریاردان " دا ، لە راستیدا پیداگرتنی ئەو حیزبەیە لەسەر سەلماندنی جۆرە " مافیكی دەسەلاتی نەتەوایەتی" لە كوردستان كە ئەوە لە بناخەوە لەگەل ئیلتیزامی حیزبی دیموكرات بە ( وحدت ملی ) كە لە گەلالەی شۆرا دا بۆ خودموختاری هاتوە یەك ناگرێتەوە".

نێوەروكی ئەو نووسراوەیە و ئەو بۆ چوونە چ دەگەیەنێ ؟ راستەو راست موجاهید " جۆرە مافیكی دەسەلاتی نەتەوایەتی لە كوردستان" بۆ حیزبی دیموكرات ناناسێ. ئەوانەی لە بارەی " سەربەخۆیی بریار - دانەوە " رەخنە لە رێبەرایەتی حیزبی دیموكرات دەگرن ، راستەو راست هەر لە ئیستاوە سەربەخۆیی و ئیرادەی خۆیان دەخەنە بەر ویست و رەحمەتی ئەو كەسانە ، كە مافی دەسەلاتی نەتەوایەتی بۆ كورد ناناسن.

ئەو دەستەو ریكخراوانەی رەخنەی " وتو ویژ " لە حیزبی دیموكرات دەگرن ، خۆیان لەگەل دەستی راستی ترین و كۆرە هەرە كۆنەپەرستەكانی سەرمایەداری رۆژئاوا شەو و رۆژ لە وتو ویژ و كەین و بەین و هاتووچۆ دان ، بەلام نە پرس بە كەس دەكەن و نە كەسیش وەبەر نەشتەری رەخنەیان دەدا .

لە بەیاننامەكەدا باسی : " باند بازی و دەستە بەندی و رایەلكەی

جاسوسی و تیرۆری شەخسیەت و پێ شێل کردنی پیرەوی نێو خـــــۆ و دیموکراسی و دیکتاتۆری " کراوە٠ بەلام رەنگە تاوانێکی گەورە بـــــە گشتی بکەوێتە سەر ئەستۆی هەموو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی کـــــە ریگایان داوە ئەم وەزعە لە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیراندا پیـــك بێ و ئەوانیش سەیری بکەن ! ئەندامیکی حیزبی کە لە ئۆرگانیك دایە ، ناتوانێ بە هیچ بیانویەك خۆ لە ژێر باری بەر پرسی لابـداو خەلـــــك تاوانبار بکاو خۆی دوور بخاتەوەو بیژی من بەشدار نەبووم و یا ئاگام لێ نەبووەوە٠ ئەوانەی " ریبەرایەتی شورشگیر" لە بەیاننامەکەدا دەینووسن، بێ هەلاواردن خۆشیان دەگرێتەوە ٠ ئەوەندە هەیە رەنگە تاوانـــــــــی هێندیکیان کەمتر بێ ٠

بەیاننامەی " ریبەرایەتی شورشگیر" پاش باسی ئەو هەموو گەنـــد- کاریە لە حیزبی دیموکراتی کوردستاندا کە خۆشیان شەریك و هاو دەنگ و هاوکار بوون ، چەند خالی وەك " ریبازی ئەساسی سیاسەتەکانی حیـزب" راگەیاندوە کە بە کورتی بۆ باس کردن دەبن ٠

دیارە ئەو خالانە مەبەستی جوانیان تیدایەو ئەنجامدانیان لـــــە بەرژەوەندی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد ( نەك میللی دیموکراتیك)دان٠ بەلام ناروون و لێل و بە قەولی رەحمەتی کاك حەسەنی قزلجی : "مشکیان تیدا کوژراوە "!

ئەندامانی حیزب هەقیانە بپرسن کە نووسراوەکانی حیزبی دیموکرات ماوەی ٩ سالە هەر ئەو مەبەست و وشەو زاراوانەیان دووپات نەکردۆتەوە؟

داخوا بە نەزەری " ریبەرایەتی شورشگیر" (ئۆپوزیسیونی ئینقلابی) کامانەن ؟ کام دەستەو حیزب و ریکخراو لە ئیراندا دەگرنەوە؟ مەفهومی وشەی (ئینقلابی) چی یە ؟ چۆن لە (ئینقلابی ) تی دەگەن؟ بزوتنـــەوەی ئیستای گەلی کورد لە کام قۆناخ دایە ؟ بزوتنەوەی رزگاریخوازی یە یـــا " میللی دیموکراتیك " ؟ " استقرار رژیم دمکراتیك " یانی چـی "

تەنیا سرفی " ریژیمی دیموکراتیك " چیّ بۆ کورد تیّدایه ؟ گەلی کورد له کوردستانی ئیران تەنیا بۆ بەجیّ گمیاندنی ئەم وشه قوربانی داوه ؟

" مطالب و موضوعات انحرافی و ارتجاعی " له بەرنامەو ئەساسنامەدا ، ( که خۆشیان دەنگیان بۆ داوه ) کامانەن ؟

له بارەی " راگرتنی شەری ئیران و عیراق " لام وا نیه شتیکی تازەیان نووسی بیّ ٠ چونکه پیّش ئەو کیّشەو هەرایەش ئەم ویسته له بلاو کراوەکانی حیزبی دیموکراتدا دەست نیشان کراوه٠

له بارەی گیرانەوەی کادرو ئەندامان و پیشمەرگەی حیزبی بۆ نیّو حیزب ، هەر ئەوەندە بەسه که بەیاننامەی دووەمی " ریبەرایەتی شورشگیّر " لەو بارەوە تەماشا بکریّ تا ناراستی و لەرزۆکی و ترسەنۆکی ئەو" شۆرشگیّرانه "لەو بارەوە ببیندریّ ٠

به چەشنی گشتی تەك هەر له بەیاننامەی خاکەلیوەدا ، بەلکو له نامیلکەی " وەلامیك به فیتنه گەری " یشدا وشەیەك له بارەی ناکوکی بیّرو باوەرو ئیدئۆلۆژی بەوە نەنووسراوه ٠ زمانی فارسی بۆ شەره دندوکەو ریز کردنی وشەو زاراوی قولومبه ئەوەندە له دەستان خۆشه که نووسەری نامیلکەی وا لیّ کردوه دمیان لاپەره رەش کاتەوه ، بیّ ئەوەی که باس و موناقەشەیەکی زانستی و بابەتی بیّنیته گۆریّ و ئەندامانی حیزب و کۆمەلانی خەلك روون کاتەوه ٠

نیّوه رۆکی نامیلکه به جوانی دەری دەخات که وەلامی نووسراوەکانی بیّ جیّ و بیّ مانای ، به قەولی خۆیان " فراکسیون " دراوەتەوه ٠ پتر ومدم به دمەو شەره فریّ بازاری دەچیّ ٠ نووسەر لەو کاتەدا که له هیّندی شویّن دیکتاتۆری و بیّ دیسیپلینی دوکتور قاسملو و دەست و پیّوەندەکانی روون دەکاتەوه ، هەر لەو کاتەشدا بیّ شەخسیەتی ئەندامانی کومیتەی ناوەندی و دەفتەری سیاسی نیشان دەدا ٠

ئەندامانی حیزبی دیموکرات هەقیانە بپرسن: ئەوانەی کە ئیستا ناوی " ریبەرایەتی شورشگیر " یان لە خۆ ناوە چۆن دەتوانن خۆیان لە ژیر باری ئەو سیاسەت و هەلویستە نالەبارە بینەنە دەری کە باسی دەکەن. ئەوان کە ئیستا رابردووی ٩ سالە حیزبی دیموکرات بە بیانوی تاوانبار کردنی دوکتور قاسملو و سەعید بەدەل پوچ دەکەنەوە، خۆیان چ ریگایەك نیشان دەدەن ؟ چ بە خەلك دەلین ؟ تەنیا شەرە دندووکە و بەیان دەرکردن دەردی میللەت و جولانەوەی کورد چارە سەر ناکا.
پیویستە ریبازی تازە و باشتر و دنیا پەسندتر بدۆزریتەوە. نووسراوەکانی " ریبەرایەتی شورشگیر " شتیکی ئەوتۆیان تیدا بەر چاو ناکەوی. ناهەقیش نین ، ئەوان هەموو ئەزموونی سیاسی و تیکۆشانیان لەو ٩ سالەدا لە ژیر سەرکردەیی دوکتور قاسملو وەدەست هیناوە. ئەگەر شتیك بزانن هەر لەوی فیر بوون ، ئەویش ئیستا ئەوەیە کە خۆیان لەسەری دەنووسن. تەماشایەکی بەیاننامەی پاش کۆنفرانسی چوار دەری دەخا کە وشەو رستەو زاراوەکان راست هەر ئەوانەن کە پاش هەموو کۆنگرەکانی حیزبی دیموکرات دەنووسران و دەرخواردی خەلك دەدران.
تەنیا پێ داگرتن لەسەر " شەری چەکدار " دژی ریژیمی ئیسلامی و چونە ژیر بالی هیزیکی دیکەی ئیسلامی ، نە شورشگیری یەو نە بۆ گەلی کۆست کەوتوو و لیقەوما و زامداری کورد هیچی لێ پەیدا دەبێ.
" ریبەرایەتی شورشگیر " ئەو کاتە دەیتوانی داوینی خۆی لەو هەموو پەلەیە پاك بکاتەوە ، کە وەك تیکۆشەرانی شۆرشگیر شەهامەت و غیرەتی ئەوەیان هەبایە کە خۆشیان لە بەریوە بردنی ئەو سیاسەتە چەوتەی کە باسیان کردوە ، بە شەریك و هاودەنگ و بەرپرس زانی بایە.
ئەو دەم دەکرا کۆمەلانی خەلك و ئەندامانی حیزبی بە جیگای بروایان دابنین و بە هیوا بن کە لە جولانەوەی رزگاریخوازی کورد دا دەوری شورشگیرانەیان دەبێ.

**سیین دەلی دان پیّ دانانی رك و راست به هەلەكان ،ئاشكرا-كردنی هۆیەكانی ئەو هەلانه ، شی كردنەوەو لیكدانەوەی بارو دۆخیكی كه بوون بە هۆی ئەو هەلانه ، باس و روون كردنەوەی وورد كه بۆ لابردنی هەلەكان پیویسته ــ ئاوایه نیشانەی حیزبیكی جیّدی ، ئاوایه شیّوەی بەجیّ گەیاندنی ئەو ئەركەی كه لە ئەستۆی حیزبه و ئاوایه شیّوەی پەروەردەو فیّركردنی چین و كۆمەلانی خەلك " ٠**

## كۆتایی :

بیبرینەوە ، لەسەر یەك سەرەرای ئەو كەم و كورییەی ریبەرایەتی حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئیران كه بەسەر بەشی هەرەزۆری دا تیپەریوم ، لەت بوونی حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئیران بە زیانی جولانەوەی رزگاریخوازی كورد دەزانم ٠ لام وایه دەبیّته هۆی لاوازبوونی خەبات و دوژمنانی بزوتنەوەی گەلی كورد لە هەر كەولیّك دابن و لە ژیر هەر ناویك دا خۆ حاشار بدەن ، كەلكی لیّ وەردەگرن ٠

ئەو شیّوە بەربەرەكانی تەبلیغاتی‌یەی كه لە هەر تك لاوە دەست پیّ كراوە ، لام وایه هەلچوونیكی بیّ مەنتق و شەرە دندووكەی بازاری یه٠ ئەم هەلویّست و بۆ چوونە ناتوانیّ هیچ مەسەلەیەك چارەسەر بكاو خزمەت بە بزوتنەوەی رزگاریخوازی كورد ناكا ٠

گەلی كورد لە كوردستانی ئیران فیداكارییەكی بیّ وینەی كردوە، خەلك لە ریگای ئازادی دا دەربەدەر بوە، مال ویران بوە، قوربانی داوە٠ دایك و بابی جەرگ براو . خوشك و برای پشت شكاو . ژن و مندالی بی سەرپەرەست و داماو . گیانی شەهیدانی ریگای ئازادی . لەوكەسانە خۆش نابن كه بەشەرە حنیّو و پیّك هەلپرژان و ناو ترتكه لیّك نان حویّنی شەهیدان به فیرو بدەن و بزوتنەوەی رزگاریخواری گەلی كورد نووشی ریگای بەردەلان و ئەستەمر بكەن